


# ڕەهـــــــا

ژمارە (1)ی لە 2017/11/30 پێنج شەممە

لەم ژمارەیەدا :

لە خزمەت حەزرەتی خۆشەویست ﷺ دەبین :

ڕەوشت بەرزی و جوانی خۆشەویست ﷺ

سەرنجێك لەسەر یادکردنەوەی لەدایك بوونی حەزرەتی خۆشەویست ﷺ

مەولوود و خۆشەویست ﷺ لە دیدی مامۆستا سەعیدی نوورسی

مێژووی یادی مەولوودی خۆشەویست ﷺ لە هەولێر

لە گوڵستانی باسی حەزرەتی خۆشەویست ﷺ

- ڕەها گۆڤارێکی مانگانەی ئەلیکترۆنییە، گرینگی بە لایەنی ئەدەبی و ڕۆشەنبیری گشتی دەدات



خاوەنی ئیمتیاز:

ـ ئەیاد نادر

Ayadqadr10@gmail.com

بەڕێوەبەری گشتی :

ـ زامدار قادری

Muhammadibrahim9232@gmail.com

سەرنووسەر:

ـ محمد مەلا سعدالدین

muhamad.gerdi@yahoo.com

بەڕێوەبەری هونەری :

ـ ارکان صدیق بەقال

Arkanbaqal1990@gmail.com

دەرهێنەری هونەری :

– دیار قادر – دیامیدیا

dyar2014qadr@gmail.com

دەستەی نووسەران :

– ارکان صدیق بەقال – ئاوارە کاوێس – ئەیاد نادر – زامدار قادری

– لێزمە وەصفی – هونەر خورشید – محمد ملا سعدالدین





# ڕەهـــــا بـــۆچـــی ؟

لە سەروبەندی زیاد بوونی گروپە جیاوازەکان و سەر لێ شێوانی تاکی موسڵمان لە نێوانیاندا، پێمان باش بوو گۆڤارێکی ئەلکترۆنی دەربکەین تاوەکو تاکی مسوڵمان بە ئیسلامە ڕاستەقینەکەی شارەزا بکەین، پێناسەی ئیسلامە ڕەسەنەکەی بۆ بکەین، ئەو رووحیانەتەی کە لە باب وبا پیری دەیبینی و ئێستا لە کەسدا بەدی ناکات، ئێمە هەوڵ دەدەین ئیسلامی بەو جۆرە پێ بناسێنین

ڕەها بۆ ئەوەیە خەڵك بەرەو دیدێکی ناوەندگیر ببەین، وایان لێ بکەین گفت و گۆی بنیاتنەر بکەن و یەکتریان خۆش بوێ ئەگەر چی راشیان لە یەکتری جیاواز بێ

ڕەها بۆ ئەوەیە مرۆڤەکان بە فیترەتی خۆیان ئاشنا بکرێن، لەگەڵ ئاشنا کردنیشیان بە بابەتە سەردەمییەکان و دانەبڕان لێیان، لەگەڵ پڕکردنەوەی ئەو کەلێنانەی لە رۆشەنبیری تاکی خوێنەردا هەن و بۆ ئەوەی دونیا بینیان جوانتر بکەین

لەو پێناوەدا، رەها لەدایك بوو، سەرەتا بیرمان لە چاپکردنی گۆڤارەکە کردەوە، بەڵام دوای راوێژ لەگەڵ دەستەی نووسەران گەیشتینە ئەوەی کە باشترین و ئاسانترین رێگا بۆ بڵاوکردنەوە، رێگای ئەلکترۆنییە، لەهەرشوێنێکی ئەو دونیایە بێت خوێنەر بەدەستی دەگات

هیوا خوازین پەروەردگار لەم کارە سەرکەوتوومان بکا و ئەو بڵاوکراوەیە ئاما نجی خۆی بپێکێ

بۆ هەر ڕەخنە و پێشنیارێك دەتوانن بەم ئیمەیلەی خوارەوە ئاگادارمان بکەنەوە

Govari.raha@gmail.com



دەستەی نووسەران

# ڕەوشت بەرزی و جوانی خۆشەویست ﷺ




ئامادەکردنی : ارکان صدیق بەقال

کاتێك لە قورئانی پیرۆزدا خودای گەورە باس لە ڕەوشتی خۆشەویست (ﷺ) دەکات دەفەرمووێت:

( وَإِنَّكَ لَعَلَى خُلُقٍ عَظِيمٍ )(القلم 4) واتە: ( بەڕاستی تۆ لەسەر ڕەوشت و خوویەکی زۆر جوان و پەسەند و بێ وێنە و مەزنیت ).

وە هەروەها کاتێك دەربارەی رەوشتی خۆشەویست (ﷺ) لە دایکمان عائیشە ( خودا لێی ڕازی بێت ) دەپرسن دەفەرموێت: ( كان خلقه القرآن ) واتە : خو و رەوشتی وەك قورئان وابوو، رەوشتە هەرە بەرز و جوانەکانی خۆشەویست (ﷺ) کە لە ژیانی دا رەنگی داوەتەوە وکاریگەری لەسەر هاوەلانی و کافرەکانیش هەبووە بریتی بوون لە :

(ڕاستگۆیی ، دەست پاکی، دەم پاکی ، دڵ پاکی ، چاوپۆشی، نەرم و نیانی ، پیاوەتی، سەنگیینی، بێ دەماری، دڵ نەرمی ، ئارامگری، داد پەروەری، ڕوخۆشی، بوێری ، بەخشندەیی، میهرەبانی ، لێبوردەیی، بە بەڵێنی، بەوەفایی).

وە هەروەها خۆشەویست (ﷺ) کاتێك باسی ڕەوشت دەکات وەك بلێی کە تەنها بۆ ڕەوشت جوانی رەوانە کرابێت وە لە چەند فەرمایشتێکی

شیرینیش خۆشەویست (ﷺ) دەفەرموێت:

( إنما بعثت لأتمم مكارم الأخلاق ) ( رواه البزار في مسنده عن أبي هريرة ).

واتە: ( من بۆ ئەوە ڕەوانە کراوم کە ڕەوشتە جوانەکان لە نێو ئێوەدا تەواو بکەم )

( أَكْثَرِ مَا يُدْخِلُ النَّاسَ الْجَنَّةَ فَقَالَ تَقْوَى اللَّهِ وَحُسْنُ الْخُلُقِ ) ( رواه الترمذي ، وابن ماجه )

واتە: ( زۆرینەی خەڵکی کە دەچنە بەهەشت، بە هۆکاری ڕەوشت جوانی و خۆپاراستنیانە لە تاوان ).

( إنَّ من أحَبِّكُم إليَّ وأقربِكُم منِّي مجلسًا يومَ القيامَة: أحاسِنكم أخلاقا ) ( رواه الترمذي ).

واتە: ( نزیکترین کەس لە مەجلیسی موبارەکی پێغەمبەر (ﷺ) لە ڕۆژی

قیامەتدا ئەو کەسەیە کە ڕەوشت بەرزترینیانە ).

خۆشەویست (ﷺ) بە ڕەوشتە بەرز و پیرۆزەکانی جوانترین و گەورەترین و باشترینی مرۆڤەکانە لە دنیا و لە قیامەتیشا، لەسەر ئێمەش وەك موسلمانێك پێویستە اقتدا بە ڕەوشتە جوانەکانی بکەین وە لە ڕێگەی ئەو ڕەوشتە جوانانەی ئیسلام وەك خۆی بگەینین بە هەمووان.

# عیشقی هاوەڵان بۆ خۆشەویست ﷺ



ئامادەکردنی : زامدار قادری

عیشق گەوهەرێکی زۆر سەیرە و هەر یەکە و بەجۆرێك رووەو رووی دەچێ و دەبێتە کرپاری ، با لایەك لە عیشقی هاوەڵانی حەزرەتی سوڵتانی دڵەکان (ﷺ ) بدەینەوە بزانین ئەمان چۆن لەو عیشقەدا ئەسپی خۆیان تاو داوە بەرامبەر حەزرەتی یاری خۆیان کە سەرداری مەحشەر و مرۆڤی شیرین کەلام ، حەزرەتی عالی مەقام ، خاوەنی وەسفی ( وما ارسلناك الا رحمە للعالمین )ە (ﷺ ) ، بزانین وەکو پەروانە بە دەوری جەماڵی ئەو دولبەرە هات و چوونە و گیانیان بۆی داناوە یان نا ؟.

ئیمامی " بوخاری ٣٨٣٧ " بۆمان باس دەکا لە شەڕی " ئوحود " دا کاتێك خۆشەویست (ﷺ ) چواردەوری گیرا حەزرەتی ( ابو طلحة ) هاتە نزیك حەزرەتی خۆشەویست (ﷺ ) و وەکو کەسێك کە گیان لەلای هیچ بایەخێك نەبێت بۆی لەبەردەم خۆشەویست (ﷺ )



وەستاو رووی کردە دوژمن و باکی بە گیانی خۆی نەبوو تەنیا مەبەستی ئەوە بوو دولبەرەکەی تەنانەت درکێکیش بە قاچی دابچێت ، کاتێ تیرەکان بۆیان دەهات ابو طلحة لەسەر پەنجەی پێیەکانی وەستا بوو تاکو ئەو تیرانە کە بەرزن هەموو بەو بکەون و بۆ خۆشەویست نەچێت و دەیفەرموو " یا رسول الله دایك و باوکم بە فیدات بێ گەردەنت بهێنە خوارەوە با بە هی من بکەوێت بەلام تۆ نا "

هەروەها هاوەڵی ئازیز ( ابو دجانة ) لە دواوە بەرگری لە خۆشەویست (ﷺ) دەکرد ، تیری بەر دەکەوت و هەر لە جێگاکەشی نەدەجوڵا ( مالکی کوڕی سینان ) لەسەر تا پای هەموو خوێن بوو کەچی هەر بە خەیاڵیشی دانەدەهات ، چونکە ئازیزەکەی لێیەوە زۆر نزیك بوو بەڵێ ئا ئەوەیە عیشقێك سەرانسەر لە پاکی و ئیخلاس .

نمونەیەکی دیکە حەزرەتی " عائیشە " ئەفەرمووێ کاتێ خۆشەویست (ﷺ) لە دەرگای ماڵی ئێمەی دا باوکم دەرگای کردەوە و خۆشەویست (ﷺ) پێی فەرموو : ئەبو بەکر خودای گەورە تۆی وەکو هاوەڵی ئەم گەشتەم دەستنیشان کردوە کە هیجرەتە لە مەککەوە بەرەو مەدینە "

لەو کاتە باوکم لە خۆشی ئەوەدا دەستی بە گریانێکی زۆر بەکوڵ کرد ، سوێند بەخوا هەرگیز کەسم ئاوا نەدیبوو لە خۆشیدا ئەوەندە فرمیسك ببارێنێت ، کاتێکیش بەرێکەوت لەو سەفەرەدا وەکو ئیمامی ( بەیهەقی لە کتێبی دلائل ) باسی دەکات کە ئەبوبەکر جارێك لە پێشی خۆشەویست (ﷺ) دەڕۆیشت جارێك لە دواوەی جارێك لە ڕاست و جارێك لەلای چەپ ، خۆشەویست (ﷺ) فەرمووی : ئەی ئەبوبەکر بۆ وا دەکەی دەترسی یەکێك ئازارم پێ بگەیەنێت ؟ ئەبوبەکر فەرمووی : بەڵێ سوێند بەوەی بە حەق تۆی ناردوە دەترسم شتێکت لێ بێت .

نمونەی زۆر هەن لەو عیشقە پاکە و کۆتا نمونە باس دەکەم کە ئەو نمونانەی هیناممەوە مشتێکن لە خەروارێك .

ئیمامی ( البغوی لە تەفسیرەکەی دا دەفەرموویت ،

ئایەتی { وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَالرَّسُولَ فَأُولَئِكَ مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ مِنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاءِ وَالصَّالِحِينَ وَحَسُنَ أُولَئِكَ رَفِيقًا } ( النساء : 69 ) لەسەر حەزرەتی ( ثوبان ) دابەزی ، وەها مەشهور بوو کە ئەو هاوەڵە بەرێزە عیشقێکی لەرادەبەدەری هەبوو بۆ خۆشەویست (ﷺ) و بگرە ئەو عیشقە ئارامی لێ هەڵگرت بوو کاتێ خۆشەویست لەلای نەبوایە ، جارێك هاتە لای (ﷺ) و رەنگی تێك چوو بوو بە جۆرێك لە دوورەوە ماتەم لێی دەباری ، خۆشەویست کاتێ وای بینی فەرمووی : ئەوە بۆ وا رەنگت تێك چووە ؟

( ثوبان ) فەرمووی : یا رسول الله نەخۆش نیم و هیچیشم بەسەر نەهاتووە تەنها ئەوە نەبێت کاتێ لێی دوور دەکەومەوە خەم دامدەگرێت بۆیە یەکسەر بۆ لات دێم ، بەڵام بیرم کردووە لەقیامەت تۆ دەچیتە بەهەشت و جێگات لە جەننەتە بەرزەکان دەبێت لەگەل پێغەمبەران و ئەگەر منیش بێمە بەهەشت بە دڵنیای لە جەننەتەکانی خوارەوە دەبم و ئەوکات پیت ناگەم ناتوانم بتبینم ، بۆیە خودای گەورە ئەو ئایەتەی دابەزاند بۆ ئارام بوونی ئەو دوو عاشقە پاکە کە دڵنیایان دەکاتەوە لە بەهەشت دا ئەوان بەیەکەوەن و یەك ئەبینن .

# سەرنجێك لەسەر یادکردنەوەی لەدایك بوونی حەزرەتی خۆشەویست ﷺ




**ئامادەکردنی: ارکان بەقاڵ**

**بەگشتی زانایان دوو ڕایان هەیە لەسەر درووستی و نادرووستی یادکردنەوەی لەدایك بوونی خۆشەویست (ﷺ) ، ئەو زانایانەی کە پێیان درووستە پشیان بەوە بەستووە کە هیچ شتێکی خرا پی تێدا نیە لەگەل مەنهەجی خۆشەویست (ﷺ) دەنگونجێت وە چەندەها بەڵگەشیان بۆ ئەمە هەیە کە ئەگەر کارێك خۆشەویست (ﷺ) نەیکردبێت و هاوەڵەکانی کردوویانە و خۆشەویستیش (ﷺ) قبوڵی بووە وە ناتوانین هیچ کام لەم زانایانە بە گومڕاو سەر لیٚ شێواو بزانین، چ ئەوانەی قبوڵیانە و چ ئەوانەی قبوڵیان نیە، یەکێك لەم نمونانەی کە هاوەڵێکی خۆشەویست (ﷺ) کارێکی کردووە بیٚ ئەوەی هیچی لەو بارەیەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) بیستبیٚ، ئەوە کە (روفاعەی کوڕی رافعی زەرقی) دەیگێرێتەوە**

رەزای خوای لەسەر بێت دەگێڕێتەوە دەڵێ: لە نوێژی جەمەعاتا بووین لەدوای خۆشەویست (ﷺ) کاتێك خۆشەویست (ﷺ) لە "رکوع" هەڵسایەوە فەرمووی: (سمع الله لمن حمده) یەکێك لە هاوەڵان ئەم دوعایەی خوێند (ربنا ولك حمداً كثيرا طيبا مباركا فيه)، کاتێك خۆشەویست (ﷺ) سەلامی دایەوە و فەرمووی: ئەوە کێ بوو وای وت؟.

هاوەڵەکە گوتی: قوربان من بووم، نوێژ کە عیبادەتێکی تەوقیفییە پێ نەفەرموو تۆ چۆن شتێك دەکەی کە من نەمکردووە؟ یان قسەی پێ بلێت و سەرزەنشتی بکات ، بەڵکو پێی

فەرموو دەی موژدەت لێ بێ سی و ئەوەندە مەلائیکەتەم بینی پێشبرکێیان بوو لەسەر نوسینی ئەم دوعایەت، مەبەستمانە بڵێین هەروەك زۆرێك لەزانایان رایان بەو جۆرەیە، کە داهێنراوەکان چەند جۆریان هەیە مەولودیش ئەو داهێنراویە کە لەگەڵ مەنهەجی خۆشەویست (ﷺ) دەگونجێت هیچ خراپەیەکی تێدا نییە بەمەرجێك هیچ شتێکی وای تێدا ئەنجام نەدرێت کە ببێتە هۆی تاوان و گوناه.

**چەند بەڵگەیەکیش لەبارەی درووستی یادکردنەوەی لەدایك بوونی خۆشەویست (ﷺ)**

**یەکەم:** خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: (قُلْ بِفَضْلِ اللَّهِ وَبِرَحْمَتِهِ فَبِذَٰلِكَ فَلْيَفْرَحُوا) {یونس: 58} واتە: بە بە فەزڵ و رەحمەتی خوا دڵخۆش بن، ئیبنو عەبباس لە تەفسیری ئەو ئایەتە پێی وایە: مەبەست لە فەزڵی خوا عیلمە، هەروا مەبەستیش لە رەحمەتی خوا پێغەمبەرە درووودی خوای لەسەر بێت. کەواتە بە گوێرەی تەفسیرو لێکدانەوەی ئیبنوعەبباس خوای گەورە فەرمان دەکات موسڵمانان بە پێغەمبەرەوە دڵخۆش بن.



دووەم: خوای گەورە دەفەرموویێت: (وَكُلًّا نَقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنْبَاءِ الرُّسُلِ مَا نُثَبِّتُ بِهِ فُؤَادَكَ) {هود:120}، واتە: هەموو جۆرە دەنگو باسێكی پێغەمبەرانت بۆ ئەگێڕینەوە كە ببێتە هۆی دامەزراندنی دڵت و بەردەوامیت لەسەر گەیاندنی پەیامەكەت و بەرگەگرتنی ئازاری كافران.

بێگومان لە رۆژگاری ئەمرۆماندا زۆر پێویستمان بەوە هەیە دڵەكانمان راگیر بكەین لەسەر رێگای راست و دروست ئەویش بە گوێگرتن لە رووداوەكانی ژیانی پێغەمبەرو تەواوی پێغەمبەران، سەلامی خوایان لێ بێ.

سێیەم: خوای گەورە دەفەرموێت: (يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اذْكُرُوا نِعْمَةَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ) {الأحزاب:9}، واتە: ئەی باوەڕدارینە!، یادی نیعمەتی خوا بەسەرتانەوە بكەنەوە. بێگومان لەدایكبوونی پێغەمبەری خواش صلى الله عليه وسلم نیعمەتێكە پێویستە هەمیشە بە بیرخۆمانی بهێنینەوەو لە یادی نەكەین.

چوارەم: خوای گەورە دەفەرموێت: (وَلَا يَطَئُونَ مَوْطِئًا يَغِيظُ الْكُفَّارَ وَلَا يَنَالُونَ مِنْ عَدُوٍّ نَيْلًا إِلَّا كُتِبَ لَهُمْ بِهِ عَمَلٌ صَالِحٌ إِنَّ اللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ الْمُحْسِنِينَ) {التوبة:120}، بێگومان ئاهەنگگێڕان بەبۆنەی ویلادەتی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم یەكێكە لەو كارانەی كافرانی نەیار بە ئیسلام تووڕە دەكات، كەواتە جێگەی خۆیەتی ئەم یادە بكرێتەوە.

پێنجەم: ئیمامی بوخاری لە سەحیحەكەیدا گێڕاویەتییەوە كە خوای گەورە هەموو رۆژانی دووشەممە عەزابی سەر ئەبولەهەب سووك دەكات، چونكە لەو رۆژە بوو موژدەی لە دایكبوونی پێغەمبەری پێدرا، بەم بۆنەوە یەك لە كەنیزەكەكانی خۆی بە ناوی "سوەیبە" ئازاد كرد.

شەشەم: ئیمامی موسلیم لە سەحیحەكەیدا ریوایەتی كردووە، كە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم هەموو رۆژانی دووشەممە بە رۆژوو دەبوو، لێیان پرسی بۆچی لەم رۆژەدا بە رۆژوو دەبیت، فەرمووی: (فِيهِ وُلِدْتُ وَفِيهِ أُنْزِلَ عَلَيَّ)، واتە: لەو رۆژە لەدایك بوونمەو، لەو رۆژەش قورئانم بۆ هاتۆتە خوارەوە.

# خۆشەویست ﷺ و لایەنە جوانەکانی لە ژیاندا




ئامادەکردنی: ئەیاد نادر

١- لایەنی تەندروستی: خۆشەویست ( ﷺ ) زۆر جەختی کردۆتە سەر لایەنی تەندروستی بەندەکانی خودا، هەر کاتێك باسی لایەنی تەندروستی دەکەین یەکەم شت بێتە خەیاڵمان بریتیە لە خواردن، خۆشەویست ( ﷺ ) لە فەرموودەیەکدا دەفەرمویٚ: ( گەدەتان بکەنە سیٚ بەش، بەشێك بۆ خواردن، بەشێك بۆ خواردنەوە بەشێك بۆ هەناسەدان). ئەگەر بێت و هەمووی بکەیە خواردن، دەبێتە گەلێك کێشەی تەندروستی بۆ لاشەی مرۆڤ، پێچەوانەکەشی چەندین کێشە درووست دەکا، زانستی پزیشکی سەردەم زۆرێك لە نەخۆشیەکانی گەڕاندۆتەوە بۆ هۆکاری خواردن و خواردنەوە .

یەکێك لەو شتانەی کە قسەی لەبارەوە دەکریٚ خواردنی گۆشتە، کەسانێك دەڵێن گۆشت جگە لە زیانی هیچی تری نیە بۆ لاشەی مرۆڤ، هەندێکی تر پێیان وایە کە گۆشت تەنها زیانی نیە بۆ تەندروستی تاکەکە، خۆشەویستی خوا گۆشتی خواردوە، میوەشی خواردوە ڕوەکیشی خواردوە، زانستی پزیشکیش ئەمەی پشت ڕاست کردۆتەوە کە خواردنی گۆشت و میوە و ڕوەك کێشەی نیە بەڵکو نەخواردنی یەکێك

لەوانە زیانی بۆ تەندروستی مرۆڤ هەیە، بەڵام ڕێژەی خواردنەکە لێرەدا مەبەستە کە نابێ زۆر بێت وە نابێت کەم بێت .

خۆشەویستی (ﷺ) ئەو شتە بەسودانەی ڕون کردۆتەوە وە لە هەندێك لە فەرموودە شیرینەکانی بە شیفا بەخش و چارەسەر ناوی بردوون وەك هەنگوین ڕەشکە زەیتون زۆری تر

٢-لایەنی کۆمەڵایەتی: خۆشەویست (ﷺ) پێشەنگی کۆمەڵناسان بووە، بە جۆرێك وای لە پەیوەندی کۆمەڵایەتی کردبوو کە پڕ بێت لەخۆشەویستی پڕ بێت لە میهرەبانی، "هەر یەکێك لەئێوە برا مسوڵمانەکەی بینی با سەلامی لێ بکات"، خودی سەلامەکە یەکەم هەنگاوی خۆشەویستیە، "سەلام لەوە بکە کە دەیناسی وە لەوەشی بکە کە نایناسی"، کەسێکی نەناس کاتێك سڵاوی لێ دەکەی هەست بە خۆشەویستی دەکات هەست بە بوونی خۆی دەکا لەناو کۆمەڵگادا، "ئیمانتان تەواو نابێ تا ئەوەی بۆ خۆت پێت خۆشە بۆ برا مسوڵمانەکەشت پێت خۆش نەبێ"، بێگومان بە ماناکەی تر ئیمانتان تەواویش نابێ تا ئەوەی بۆ خۆتان پێتان خۆش نیە بۆ براکەشتان پێتان خۆش نەبێت، "ئەوەی ناخۆشییەك لەسەر برا مسوڵمانەکەی لابا خوداش ناخۆشی دوارۆژی لەسەر لا دەبات (بڕوادار بەرامبەر بڕوادار وەك یەك لاشە وایە ئەگەر ئەندامێکی ئازاری پێبگات ئەوا تەواوی ئەندامانی تری ئازاریان پێ ئەگا).

خۆشەویست (ﷺ) بەم شێوازە بەرزە مسوڵمانانی هەنگاو بە هەنگاو بەرەو پلە بە پلەی کۆمەڵایەتی بردوە لە هەموو ڕووەکانەوە، "بەهەشت لە ژێر پێی دایکانە"، "لە کارە بەرزەکان چاکە کردنە لەگەڵ دایك و باوك"، "ئەگەر یەکێك هاتە داوای کچەکانتان لە دین و ڕەوشت دڵنیا بوون بیدەنێ"، "ئیمانی تەواو نابێ ئەوەی منداڵەکەی خۆش نەوێ ماچی نەکا"، بێگومان مشتێکە لە سەدان فەرموودەی شیرین کە لەو بارەوە هاتوە، "پەیوەندی خزمایەتی وەك پەتی خوایە هەرکەس پەیوەندی خزمایەتی بپچڕێنێ وەك ئەوە وایە پەیوەندی نێوان خۆی و خوای پچڕاندبێ"، بەم جۆرە خۆشەویستی خوا پلە بە پلە پایە بە پایە مرۆڤی ئیماندار فێرە پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان دەکا تا لوتکە .

٣- لایەنی ماددی: خۆشەویست (ﷺ) هەمیشە هەوڵی داوە باری خۆشگوزەرانی تاکەکان فەراهەم بکات لەلایەنەکانی ژیانیان، لایەنە پێویستەکانی ژیان بواری ماددی بووە، خۆشەویست (ﷺ) لە دوعاکانیدا دەیفەرموو "پەروەردگارا من پەنات پێدەگرم لە هەژاری و نەداری" لە ووتە شیرینەکانی بە هاوەڵە نازدارەکانی دەفەرموو "هەژاری نزیکە سەرکێشیێ بۆ کافر بوون" هەمیشە وای لە تاکەکان دەگەیاند کە ماڵ نەکەوێتە دڵیان چونکە ماڵ مەبەستی سەرەکی نییە لە ژیانی مرۆڤ، مرۆڤ نابێ هەموو ژیانی لە پێناو کۆکردنەوەی ماڵ و سەروەت و سامان بێت، بەڵکو ماڵ هۆکارێکە بۆ ڕەزامەندی خوا بۆ خێرکردن بۆ خۆشگوزەرانی تاکەکانی کۆمەڵگا، خۆشەویست (ﷺ) دەستی کرێکارێکی بەرز کردەوە لە نێو هاوەڵان فەرمووی "ئەم دەستانە خوا و پێغەمبەرەکەی خۆشیان دەوێت" لەو ١٠ هاوەڵەی موژدەی بەهەشتیان پێدرابوو لەدەوڵەمەندەکانی شاری مەدینە بوون، عبدالرحمن کوڕی عوف کاتێك هیجرەتی کرد هیچ پارەیەکی نەمابوو خۆشەویست برایەتی لەگەڵ ئەنسارێك پێك هێنا، هاوەڵە ئەنسارییەکە پێی فەرموو ماڵم ئەکەمە دوو بەش، نیوەی بۆ تۆ نیوەشی بۆ من، عبدالرحمن پێی فەرموو نەخێر، بازاڕم پیشان بدە من دەزانم پارە پەیا بکەم تا گەشتە ئەو ڕادەی کە بفەرمووێ واللە ئەگەر بمەوێ لە ژێر بەر ئاڵتون دەردێنم .

خۆشەویست (ﷺ) دەربارەی بیری "رۆمە" فەرمووی: "کێ دەیەوێ بەهەشت بکرێتەوە با فڵانە بیر بکرێتەوە تا مسوڵمانان سودی لێ ببینن" ئەگەر مسولمانان لایەنی ماددییان باش نەبێ چۆن ئەم جۆرە کارانە دەکرێن؟، خۆشەویستی خودا ئەم زاتانەی دروست کرد.

٤_ لایەنی خێزانداری : وتیان (ئەی خۆشەویست (ﷺ) لە مرۆڤەکان کێت لە هەمووان خۆشترئەوێت ؟ فەرمووی هاوسەرەکەم"عائیشە" زۆر بە ڕاشکاوی وەڵامی دایەوە هاوسەرەکەم خۆش دەوێت، یەکێك لە هاوسەرەکانی ئەفەرمووێت: هەرگیز خۆشەویست (ﷺ) لە هاوسەرێکی خۆی نەداوە، ئەوەندە خەدیجەی خۆش ویستوە تا ئەو ڕادەیەی هاوڕێ و دەستە خۆشکیشی خۆشویستووە، ئەو شوێنەشی خۆش وویستوە کە پێشتر لەوێ بووە ،



لە یەکێك لە جەنگەکان دوای ئەوەی بەرەو مەدینە دەگەڕێنەوە بە دایکمان "عائشە" دەفەرمووێ "پێشبڕکێ بکەین؟" پێشبڕکێیان کرد خۆشەویستی خوا بردیەوە بە عائشە ئەفەرمووێ ئەمە تۆڵەی جارەکەی ترە، خۆشەویست (ﷺ) ئەگەرابییەوە ماڵەوە ئەیفەرموو چیمان هەیە؟ ئەگەر بیان فەرمووبا هیچ، خۆشەویست (ﷺ) دەیفەرموو دەی کەواتە من بەڕۆژووم، لەو میهرەبانیەی خۆشەوسیت (ﷺ) ووتەکان ناتوانن وەسفی گەورەیی و مەزنی ئەو سەروەرە بکەن، ئەوەستن لە ئاستیدا، ئاوا گرنگی بە خێزانەکانی داوە ئەوە مشتێکە لە خەرمانێکی زۆری ڕوداوی ژیانی کە هەمووی پێمان دەڵێ ئەو چ کەسایەتیەك بووە لە ڕووی خێزانداریەوە چ کەسانێکی پێگایاندوە.

٥_ لایەنی کەسایەتی: خۆشەویست (ﷺ) هەمیشە کەسێکی ڕووخۆش و قسە خۆش بووە، لە ژیانی خۆیدا نە جنێوێك نە قسەیەکی ناشرین نەبووە، هەمیشە هانی هاوەڵە خۆشەویستەکانی داوە بەوەی قسە خۆش بن ڕویان خۆش بێت ئەمانە گشتی بە خێر بۆیان دەنووسرێ، ئەو خۆشەویستە (ﷺ) هەرگیز نەبووە لەگەڵ منداڵێك بە ئەقڵیەتی گەورە ڕەفتار کات، هەرگیزیش نەبووە لەگەڵ بەساڵاچوان بە ئەقڵیەتی گە نجان ڕەفتار کا، بەڵکو ئەو سەروەرە جۆرێك بوو هەر کەسێك ئەچوویە لای ئەی ووت من خۆشەویسترین کەسم لەلای ئەوەندە گرنگی بە تاکەکان ئەدا، خۆشەویستی خوا کەسایەتیەکی خۆبەزل زان نەبووە بەڵکو فەرموویەتی: "هەرکەسێك یەك تۆزقاڵ خۆبەزلزانی تیادا بێت با شوێنی خۆی بۆ ئاگر خۆشکات"، خۆشەویست (ﷺ) کەسایەتییەکی سەرکردە بووە لە بواری بەڕێوەبردندا لە بواری جێبەجێکردنی کارەکانی گرنگترین کاری ژیانی ئەم خۆشەویستە (ﷺ) ئاما نجەکەی بوو کە هەموو جیهان دژی بوو بەڵام ئەو کەسایەتیەکی ئەوتۆی هەبووە کە مێژوونووسان باسی دەکەن بە بوێری و چاونەترسی تا گەشتە بەدەست هێنانی هەموو ئاما نجەکانی لە ژیانیدا، ئەوەندە گرنگی بە گەنج و لاوان ئەدا تا کەسایەتیەکی ناوازەیان لێ دروست بکا، ئەبینین سوپایەکی (١٠) هەزار سەربازی ئەداتە دەست ئوسامە کە تەمەنی (١٦) ساڵ بووە .

بێگوومان ئەو خۆشەویستە دەیەهای ئاوای پێگەیاندوە کە تاریکیان بەرەو ڕووناکی گۆڕی.

# مێژووی یادی مەولوودی خۆشەویست ﷺ لە هەولێر



ئامادەکردنی: زامدار قادری

یادی لە دایك بونی حەزرەتی بۆنخۆشی دڵەکان و ئاوی سازگاری رۆحەکان و فریشتەی نێو گولزارەکان و هەناسەی دڵە رۆشنەکان و سەرداری ئیماندارەکانی سەر زەوی حەزرەتی محمدی باوکی قاسم ( ﷺ ) و شاری هەولێر مێژوویەکی کۆنیان هەیە , هەر کاتێ یادی مەولود دێتەوە یاد و مەوسیمەکەی دەگەڕێتەوە هەموو بە تێکرا هەولێر و سوڵتان موزەفەرەددینمان دێتەوە خەیاڵ, چونکە هەم وەکو یەکەم کەس کە یادی مەولودی بەو شیوازە رێك و پێکە دانا و هەم بەشێوەیەك رێز و حورمەتی ئەو یادە و خاوەنی یادەکەی ( ﷺ ) گرت کە هیچ کەس دەرکی پێ نەکرد و بە نێو دڵیشی دا نەهات.

سەرەتا بچینە خزمەت سولتانی هەولێر موزەفەرەدینی کۆکبری بزانین کێیە ؟

ناوی ئەو زاتە " مظفر أبو سعیدی کوکبری کوڕی عەلی کوڕی بکتکین کوڕی محمدە" لە شەوی "٢٧/ ١/ ٥٤١" لە شاری هەولێر لە دایك بووە وشەی کۆکبری بە مانای ( گورگی شین ) دێت ئەمەش لەبەر ئازایەتی وای پێ گوتراوە . لە جیهادی دژ بە مەسیحیەکان بەشداری کردووە و تایبەت تر لە جیهادی قودس و سەرکردەی لایەکی سوپای سەلاحەددینی ئەیوبی بووە ، لەبەر متمانە و ئازایەتی سەلاحەدین خوشکی خۆی پێدەدات بەناوی ( ربیعە خاتوون )

پاش وەفاتی برایەکەی " زەینەدین یوسف " بووە بە فەرمانڕەوای هەولێر و شارەزوور لەسەر داوای سلاحەدین . (بڕوانە : سیر اعلام النبلاء، الذهبي، 335/22).

تا بڵێی کەسێکی کارگێری بووە و چەندین کاری گرنگی ئە نجام دا لەوانە کردنەوەی نەخۆشخانەکان و کردنەوەی خان و دابین کردنی ئاو و نان بۆیان و خزمەتکردنیان ، هەروەها زۆر حەزی لە زانست و زانیاری کردوە و برەوی بەوە داوە و زانایانی لە دەرەوەی هەولێرەوە هێناوە و قوتابخانەی ئاینی بۆ

کردونەتەوە و ئەرکی هەمووانی خستۆتە سەر شانی خۆیەوە تەنیا بەو مەرجەی بخوێنن و زانای چاکیان لێ دەربچێت.

هەروەها پارەی ناردووە بۆ ولاتی حیجاز و هەژارەکانی ئەوێی یارمەتی داوە و خزمەتی بە ریگاوبانەکان کردوە تاکو حاجییەکان بە ئاسانتر بتوانن فەریزەکانیان ئە نجام بدەن .

سەبارەت بە مەولوودەوە کە باسەکەی ئێمەیە :

ئیبنوششەعاڕ لە کتێبی (عقود الجمان،156/5) دەفەرمووێ : (موزەفەردین شتێکی ئەوتۆی داهێنا ، نە میرەکانی ئێستا و نە خەلیفەکانی پێشتر نەیاندەزانی و نەیانکردبوو ، پیرۆزبایی و ئاهەنگ گێڕان حورمەتێك بوو لە پێغەمبەر (سەلامی خودای لەسەربێت)

عومەری لە کتێبی (منهل الاولياء و مشرب الآوصياء من سادات الموصل الحدباء،32/2) ، دەفەرمووێ : ( پێش سوڵتان موزەفەردین کەس ئەو یادەی ئاوا ڕێکخراو بەرچاو نەکردبوو).

ئیبنو خەلەکان لە کتێبی (وفات الاعيان، 275/2) دەفەرمووێ : (دوو مانگ بەر لە هاتنی رۆژی مەولود ، موزەفەردیین بە پێش خەڵکەکە دەکەوت و لەگەڵ کارگەرەکاندا کە پر و گومەزێکی زۆری لە تەختە درووست دەکرد و بە خیوەتی گەورە بانی حەوشە و گۆڕەپانەکانی دەگرت بۆ ئامادەکاری و پیشوازی میوانان)



**هەروەها دەفەرمووێ(3/١٧٢ ) : لە سالی ( ٦٠٤هـ ) پێشەوا (ئیبنو دحیەی ئەبلەنسی) کتێبێکی دانا بە ناوی (کتاب التنویر في مولد السراج المنیر) بە دیاری پێشکەشی سولتان موفەرەدەین کرد و لەبەردەم سوڵتان خوێندیەوە ، سوڵتانیش هەزار دیناری خەڵات کرد.**

**هەروەها ئیبنو کەسیری دیمەشقی لە کتێبی (البدایة و النهایة، 137/13) دەفەرموێ: (ئیبنو شەعار وتی : من یەکێ بووم لەوانەی کە گوێیم لێبوو کتێبەکە بۆ مەلیکی گەورە سوڵتان موزەفەردینی گۆگبوری دەخوێنرایەوە).**

**هەروەها ئیبنو خەلەکان دەفەرمووێ : ( هەولێر لە شەش ئە نجومەن و کۆبونەوەدا گوێمان لەم کتێبە گرتووە).**

**هەروەها ئیبنولجەوزی لە کتێبی (مرآة الزمان،681/8) دەفەرمووێ : (ئەو خواردنانەی ئامادەدەکران بۆ ئاهەنگەکە زۆربوو وەکو مەڕ و گا و حوشتر ....... هتد ،**

**هەروەها خوانەکە زیاتر لە هەزار سەر ئاژەل و دە هەزار مریشکی برژاوی لەسەر بووە، سەد هەزار سینی و سی هەزار دەفری پڕ لە حەلوای لەسەر ڕیزکراو بۆ ئامادەبوان و فەقیر و هەژاران).**

# مەولوود و خۆشەویست ﷺ لە دیدی مامۆستا سەعیدی نوورسی



ئامادەکردنی: لیزمە وەصفی

پێغەمبەری بەڕێز (ﷺ) کە بەڵگەی گۆیای "یەکتاناسی"یە، زۆر بە ڕوونی و ئاشکرایی و بە هەموو هێزێکیەوە "یەکتایی" خوای گەورەی ڕاگەیاندووە و، بۆ مرۆڤایەتیی باس کردووە و، ئەمەش لە هەموو مێژووی ژیانی خاوێنیدا دەردەکەوێت. چونکە هەر ئەوە کە بە دووباڵی: "ڕیسالەت" و "ویلایەت"ەوە خاوەنی هێزی یەکدەنگی و تەواتوری هەموو پێغەمبەرەکانی پێش خۆی و ئەولیا و پیاوچاکەکانی دوای خۆیەتی و، بەم هێزە مەزنەوە لە بەردەم ناسینی خوای گەورەدا پە نجەرەیەکی گەورە و فراوانی، بە ئەندازەی فراوانیی جیهانی ئیسلام، کردووتەوە. ئیتر ملیۆنان زانای لێکۆڵەر و پیاوچاکانی بێگەرد و صیددیقانی وەك: ئیمامی غەزالی و ئیمامی ڕەببانی و محیّدینی عەرەبی و شێخی گەیلانی و کەسانی تری جگە لەمانیش، لەم پە نجەرەیەوە ڕوانیویانە و، بۆ خەڵکی تریشیان ڕوون کردووەتەوە.

- بزانە کە ئاسەوارەکانی حەزرەتی محەمەد (ﷺ)، هەروەها ژیانی پیرۆزی و، مێژووی ژیانی، شایەتی دەدەن تەنانەت بە سەلماندنی دوژمنانیشی لەسەر ئەوەی کە خاوەنی ڕەوشت و خوویەکی گەورەیە و، سەرجەم ڕەوشتە بەرزەکانی تێدا کۆیە.

خۆ ئاشکرایە کە تێکەڵبوونی ئەو ڕەوشتانەش دەبێتە هۆی بەرهەمهێنانی دەروون بەرزی و پلەیەکی کۆمەڵایەتی و شەرەف و ویقارێك کە ڕێ نادەن بە دابەزین بەرەو کاروبارە نزمەکان. جا هەروەك بەرز و خاوێنیی فریشتەکان ڕێ بەوە نادەن کە شەیتانەکان

تێکەڵیان بن، کۆی ڕەوشتە بەرزەکانیش بە هەمان جۆرن، هەرگیز بوار بە تێکهەڵکێش بوونی فێڵ و درۆ لە نێوان خۆیاندا نادەن..

ئایا نابینی ئەو کەسەی کە تەنها بە "ئازایەتی"

ناوبانگی دەرکردووە، چۆن خۆی بەرز و بڵند ڕادەگرێت لە "درۆ"، مەگەر بە زۆر زەحمەت؟ ئەی ئەگەر هەموو ڕەوشتە بەرزەکان لە کەسێکدا کۆببنەوە دەبێ چۆن بێت؟

بەمەش سەلما کە زاتی پیرۆزی ئەو بە(ﷺ) وێنەی خۆر وایە، بەڵگەیە لەسەر خۆی!

خوێندنەوەی مەولوودنامەی پێغەمبەر و قە(ﷺ) سیدەی میعراج، عادەتێکی ئیسلامیی جوان و گەلێ سوودبەخشە، تەنانەت مایەی پێکەوە دانیشتن و هاودەمییەکی ناسك و خاوێنە لە ژیانی کۆمەڵایەتیی موسڵماناندا. هەروەك دەرس و وانەیەکە لەوپەڕی تام و لەزەت و خۆشیدا بۆ یادخستنەوەی ڕاستییەکانی ئیمان و، بەهێزترین هۆکاری کاریگەر و ورووژێنەرە بۆ: دەرخستنی نوورەکانی ئیمان و بزواندنی خۆشەویستیی خوا و عیشقی پێغەمبەر لە (ﷺ) دڵی موسڵماناندا.

# چەند وتەیەکی دکتۆر بوطي لەسەر یادی مەولوودی خۆشەویست ﷺ



ئامادەکردنی: ئاوارە کاوێس

ئەو کەسانەی ساڵانە ئاژاوە ئەنێنەوە لەم مانگەدا مەبەستیان زانست نییە چونکە ساڵانە هەمان ئاژاوە دروست ئەکەن ئەلێن مەولود کردن بدعیە گوێ ناگرن بۆبەرامبەریان گەر هەزار بەلگەشیان بۆ بێنەوە لەکاتی گفت و گۆ کردن دەست ناگرن بە ئەدەبی زانستی کە هەروەك با پیرا نمان و سەلەفی ئەم ئومەتە دەستیان پێوەگرتبوو بۆیە وەڵام بۆ ئەوان بێ سودە چونکە لە سەرەتا مەبەستیان ئاژاوەیە ئەگەرنا بابێکی فقهی ئەوهەرا نانەوەی ناوێ چۆن جیاوازی سەدان بابەت کەلە مەولود کردنیش گەورەترن لای فوقەها نەبوەتە هۆی دروست بونی هەرا کەواتە واز لەو ئاژاوە گێرانە بێنن وە ئێوەی خاوەن ژیر هەڵەچوون ئەمانەش بزانن تاوەك و فێرتان لێنەکرێ ئەوان دەڵێن گەر مەولود کردن باش بوایە خۆشەویست (ﷺ) دەیکرد ئێوەش بڵێن دەلیلێکی اصولی هەیە کە ئیجماعی لەسەرە ئەڵێ: (ترك النبي صلي الله عليه وسلم لفعل لا يدل علي تحريمة) واتا: (نەکردنی خۆشەویست (ﷺ) بە کارێك نیشانە نییە لەسەر حرامیەتی ئەوکارە) نمونە خۆشەویست (ﷺ) زیاتر لە (١٣) رکەعات شەونوێژی نەکردوە کردنی زیاتر لەو ژمارەیە حرام نی یە بەلکو پاداشتیشی هەیە یان بەستنی کۆڕ و سیمنار و گشتیان خۆشەویست (ﷺ) نەیکردوە مانای وانی یە کە حەرامن بەلکو پاداشتیشیان بۆهەیە بەگوێرەی

نییەت جگەلەمانە دەلیلێكی اصولی هەیە كە ئیجماعی ئومەتی لەسەرە ئەڵێ: ( ما لا یتوقف واجب إلا به فهو واجب وما لا یتوقف مندوب إلا به فهو مندوب )

واتا ( واجبێك ئەنجام نەدرێ تەها بەكارێك نەبێ ئەو كارە واجب دەبێ وە سونەت ئەنجام نەدرێ تەنها بەكارێك نەبێ ئەو كارە دەبێتە سونەت ) نمونە هەركەسێك بۆ شەونوێژ هەلنەستێ تەنها بە دانانەوەی سەعات نەبێ ئەوا دانانەوەی سەعات دەبێتە سونەت وە ئەگەر بۆ نوێژی بەیانی هەلنەستێ تەنها بە دانانەوەی سەعات نەبێ ئەوا دانانەوەی سەعات دەبێتە واجب چونكە بە دلیلێكی تری اصولی هەیە ئەڵێ : ( حكم الوسیلة حكم الغایة ) واتا : ( حوكمی هۆكار حوكمی ئاما نجەكەیە ) كەواتە ئەو كەسەی بەهۆی مەولود تەوبە بكات مەولود كردن بۆی دەبێتە واجب وە ئەوەی مەولود كردن بۆی ببێتە هۆكاری زیاد كردنی ئیمان ئەوا مەولود كردن بۆی دەبێتە سونەت بەراستی زیاد بونی خۆشەویستی لەدڵی خۆشەویستان تەنها بە باس كردن و ناوهێنانی خۆشەویست دەبێت .

# گوڵزاری شاعیرانی کورد لە خزمەت خۆشەویست ﷺ




**ئامادەکردنی: محمد ملا سعدالدین**

ئەگەر بمانەوێت لە شیعری ئاینی لە ئەدەبی کوردی بدوێین ئەوا چەندین بەرگ کتێب بەشمان ناکات، و بۆ ئەو کارەمان بابەتێکی کورت کەمتەرخەمییە .

بەڵام لەو بابەتەماندا هەوڵ دەدەین کە تیشك بخەینە سەر بەشێك لەو شاعیرانەی کە شیعریان بۆ خۆشەویست نوسیوە و بەو جۆرە شیعرە بەناو بانگن، هەرچەندە ناتوانین ناوی هەموو ئەو شاعیرانە بنووسین کە مەدح و سەنایان بۆ خۆشەویست بە شیعر دارِشتوە، بەلام لانی کەم باسی هەندێکیان دەکەین و شیعرەکانیان دەهێنینەوە لەگەڵ ناویان و ساڵی لەدایك بوون و وەفات کردنیان :

بێخود : بۆیە بە بێخود دەست پێ دەکەین چونکە ئەو شاعیرە مەزنە لە چوارینەیەکی دا ناوی خۆی بردووە بە (باغەوانی باغی مەدح)ی خۆشەویست (ﷺ).

**بێخود :** ماموستا مەلا مەحمودی موفتی کوڕی مەلا ئەمینە، لەساڵی 1296ی کۆچی هاتووەتە دونیاوە و لە ساڵی 1376 ی کۆچی دونیای بەجێ هێشتووە :

**بێخود لە خۆشەویستی (ﷺ) پێغەمبەر دەڵێ :**

**لە ئەووەل و لە ئاخیرا مەداری ئەنبیایە ئەو**

**لە باتین و لە زاهیری حەبیبی کیبریایە ئەو**

**کە چونکە لای خودا قسەی بەڕاستی ڕەوایە ئەو**

**دە موژدە بێ لە ئوممەتی کە گەورەییکی وایە ئەو**

**لە ڕۆژی مەحشەرا تکایە هەموو گوناحکار ئەکا**

**پەیەمبەرێ کە باعیسی وجود و خەڵقی عالەمە**

**کە تاقە سورای عەرسەیی شەفاعەتە و موسەللەمە**

**کە زام و هیجر و میحنەتی سرور و وەسڵ و مەرهەمە**

**لەهەفت خوانی سینەدا موژەی خەدەنگی ڕۆستەمە**

**لە فەتحی( خەیبەر)ە دڵا بڕۆی لە ( ژولفقار) ئەکا.**

**حەمدی: ناوی تەواوی ئەحمەد فەتاح بەگ حاجی برایم بەگی ساحێب قڕانە، لە ساڵی 1876ی زاینی لەدایك بوە و 1936یش كۆچی دووایی كردووە .**

**حەمدی لە مەدحی خۆشەویست دا (ﷺ) دەفەرموێت :**

**كـاسـەی سـەری كاسـە خـول ئـەدا مەجمەری گەردوون**

**سەرمەستە لە نەشئەیی گوڵی خۆش بۆیی موحەممەد**

**ئـیـعـجـازی دەم و دەسـتـی مـەسـیـحـا و كـەلـیـمـی**

**هـەردوو دەم و دەسـت كـەوتـنـە بـازوویـی مـوحـەمـمەد**

**مـەیـدانـی جـیـهـان تـەنـگـی بـەبـێ وادیـی مـوحـەمـمەد**

**بـۆ بـەرقـی بـوراقـی بـە تـكـا پۆیـی مـوحـەمـمەد**

**نالی :** مەلا خدری ئەحمەدی شاوەیسی میکایلیە، لەساڵی لەدایك بوون و مردنی ناكۆكی هەیە و زۆر ڕوون نیە كەی لەدایك بووەو كەیش وەفاتی كردووە، ناڵی لە خۆشەویستی بۆ پێغەمبەر (ﷺ) لە شیعرێكی درێژدا دەڵێ :

چ نـورێـكـە لـە حـوجـرەی ڕەوزەدا وا قـــائـیـمـە قـــوبـــبـــەی؟

قـــەوامـی عـــەرش و فــەرش قــەلـبـی ئـیـنــس و قالەبی جانە

چ حــوجــرە ؟ حــوجــرەیــی عولیا كەوا نەعلەینی خوددامی

دوڕڕی تاجــی ســەری قــوتــب و شــاە و وەلــی و ســوڵـتـانە

چ حــوجــرە ؟ وا لــەخــاكــی مـیـلـلـەتـی دەوڵـەت پـەنـاهـیـدا

كــەمـیـنـە خــادیـمی ســوڵـتـان و شــاهـەنـشـاهـی دەربــانــە

چ قــوبــبــە ســیـلـسـیلەی قیندیل و شەمع و بابی میحڕابی

شــوعــاعــی نــووری دیـدەی كـەوكـەبـی ئـەیـوانـی كەیوانە

**حەریق :** مەلا ساڵحی کوڕی مەلا نەسرولڵای زێوەییە، لە ساڵی 1851ی زاینی لە دایك بوە و لە ساڵی 1907 وەفاتی کردووە .

**حەریق لە خۆشەویستی موحەممەد دا (ﷺ) دەڵێت :**

**بەو نوورە کە زاهیر بوو لەسەر ڕوویی موحەممەد**

**عالەم بە هەموو ئاشفتە بوو وەك موویی موحەممەد**

**مەخجول و سەر ئەفگەندەیە نەسرین و بنەوشە**

**بو مویی سەمەن بوی دوو گیسووی موحەممەد**

**مەجزووبە هەمووکەس بە ڕەموز و بە ئیشارە**

**مەجبورە لەدەست ساعید و بازووی موحەممەد .**

**لوتفی :** شێخ لەتیف شێخ رەزا شێخ مارفی قولەییە، لەساڵی 1905ی زاینی لەدایك بوە و لەساڵی 1989 وەفاتی کردووە، لوتفی دەڵێ :

**یا ڕەسولەللا دەخیلەك ماڵی وێران بێ منم**

**چاو بە ئەشك و دڵ بە ئاه و عوسیان بێ منم**

**روو ڕەشی دونیا و قیامەت توێشەی ڕاهم نی یە**

**نائومێدی کردەوەی خۆم ڕەنج بە خەسران بێ منم**



**عاصم :** ناوی حەسەن شێخ موحەیەددینە و لە ساڵی 1912ی زاینی هاتۆتە دونیاوە و لە ساڵی 1980ی زاینی دونیای بەجێ هێشتووە، عاصم لە نەعتی خۆشەویست دا (ﷺ) دەفەرموێ :

**ئەلا ئەی سەروەری عالەم حەبیبی شاهی یەزدانی**

**بـەیـانـی گـەورەیـی تـۆیـە هـەمـوو ئـایـاتی قورئانی**

**نـەبـی بـوی تۆ کە ئادەم بوو لەنێو مابەینی ئاو گڕ**

**ئـەتـۆ بـوی بـەواسـیـتـەی تـەبدیلی نورانی زوڵمانی**

# لە گوڵستانی باسی حەزرەتی خۆشەویست ﷺ




ئامادەکردنی :هونەر خورشید

باسکردنی کەسایەتیی بەرز و ناوازەی حەزرەتی موحەممەد موستەفا ﷺ زیاد لە باسکردنیش پێشکەش کردنی وەك چارەیەك بۆ ڕزگاریی مرۆڤایەتی و، ئیکسیرێك بۆ دەردە ناسۆرەکانی، هەروەها ناساندنی ژیانی موبارەکی بە شێوەیەك شایستەی ئەو زاتە مەزنە بێت، دەبێت خواست و خولیای هەموو یەکێك لەو کەسانە بێت کە خۆیان بەشوێن کەوتەی دادەنێن.

ئەو ﷺ مایەی شانازی مرۆڤایەتییە، ئەوەتا چواردە سەدەیە لە سەرانسەری دنیادا، گەورەترین بیرمەند و کەڵە فەیلەسوف و ئەو زانا و ڕووناکبیرانەش کە هەر یەکەیان ئەستێرەی گەشی ئاسمانی هزر و بیرمانن، لە دوایەوە دەستەنەزەر وەستاون و، لە ڕوویدا دەڵێن : " تۆ ئەو مرۆڤەیت کە شانازی بە شوێنکەوتەییتەوە دەکەین"

بۆ گەورەیی ئەو ﷺ ئەوەندە بەسە کە سەرباری ئەو هەموو تێکدان و کاولکارییە ماددی و مەعنەوییانەی لەم چەرخەدا کراون، کەچی هێشتا لە منارەکانەوە زایەڵەی " أشْهَدُ أنَّ مُحَمَّداً رَسُول اللّه ِ " دەبیستن و

**شاباڵ گرتەی ڕۆحی ڕەوانی موحەممەدی بە هەموو لایەکدا دەبینن و، لەگەڵ ڕۆحانییەکاندا ڕۆژی پێنج جار دێینە جۆش و خرۆش ..**

**لە ئـــــەووەڵ و لە ئـــــاخرا مـەداری ئـەنبیـــایە ئەو**

**لـــە بـــاتیـــن و لە زاهیـــرا حـەبیبی کیـــبریـــایە ئەو**

**کە چـونکە لای خـودا قسەی بە ڕاستی ڕەوایە ئەو**

**دە موژدە بێ لە ئوممەتـی کە گەورەییێکی وایە ئەو**

**لە ڕۆژی مەحشــەرا تکــای هەمـــوو گـــوناهکار ئەکا**

**بەڵێ، زەمەن پیر دەبێت و بەساڵا دەچێت، هەروەك چۆن هەندێك فیكر و بۆچونیش پووچ و نابوود دەبن و لە بەها دەکەون، بەڵام ئەوە تەنها حەزرەتی موحەممەدە ﷺ کە لە دڵی ئیمانداراندا وەك خونچەیەك وایە کە هەر ڕۆژە و زیاتر دەپشکوێت و، دائیم لە نوێبوونەوەدایە.**

**ئەوانەی چەندەها ساڵە هەزارەها جار شوێنیان گۆڕی و، وێڵی لقێکن کە خۆیانی پێوە ڕاگیربکەن، ئەوانەش کە وا لەم سیستەم بۆ ئەو سیستەمە و، لەم ڕێباز بۆ ئەو ڕێباز لە هەناسەبڕکێدان، زوو بێت یا درەنگ، مایە پووچی و بێ ئاکامیی کرد و کۆششەکانیان دەبینن و، بە پرتاو بەرەو مەکتەبەکەی حەزرەتی موحەممەد ﷺ ڕادەکەن، ئەو مەکتەبەی کە هەرگیز نشوستی بەخۆیەوە نەدیووە، ئەوە مۆریس بۆکای و ڕۆجی گارودی و چەندەهای تری نەناسراویش ...**

**ئەگەر سەرجەم ئەسحاب و تابیعین و شوێنکەوتوانی تابیعین و ئەوانەی دوای ئەوانیش و، ئەو کەسایەتییە مەزنانەش کە تا ڕۆژی قیامەت دێن و ئەو خواناسانەش کە ڕێچکەی چوونە نێو دڵانیان دۆزیوەتەوە و تێکڕای ئەولیا و ئەسفیا و موقەڕڕەبین، هەر هەموویان لەتای تەرازوویەکدا دابنرێن،**

**ئەو دیسان سوڵتانی دڵان، نووری چاوان ﷺ قورستر دەبێت، ئاخر بوون لەبەر حورمەتی رووی ئەو بەدی هێنراوە.**

بەڵێ، پێغەمبەری خوا ﷺ هۆی بەدیهاتنی بوونەوەرانە، لە وتەیەکدا کە وەك فەرمووده ناوبانگی دەرکردووە، بەم جۆرە باسکراوە: (لَوْلاكَ لَوْلاكَ مَا خَلَقْتُ الأَفْلاكَ) "ئەگەر تۆ نەبوویتایە، بوونم بەدی نەدەهێنا بەڵێ نووسینی کتێبێك کە تێگەیشتنی مەحاڵ بێت، کارێکی بێ هوودەیە، خوای گەورەش لەهەموو کارێکی بێ هودە و بەهەوانتە پاك و بێگەردە، بەم جۆرە، زۆر پێویست بوو کە ڕابەرێکی دەنگ زوڵاڵی وەك سەرداری زەمان و مەکان، حەزرەتی عالی مەقام ﷺ واتای دێرەکانی گەردوون ڕوون بکاتەوە، هەروەك چۆن بوونی ڕاڤەکارێك (شارِح) و گەیەنەرێك (مُبَلِّغ) پێویست بوو، تا ڕاستیەکانی پشت پەردەی بوون ئاشکرا بکات، هەروەها ئەو مرۆڤەی کە گەردوونی بێ بن بە خۆر و مانگ و ئەستێرەکانی ناویەوە بۆ خزمەتی ڕام کراوە، ئاگادار بکاتەوە لەوەی کە لەکوێوە هاتووە .. بۆ کوێ دەڕوات .. و نامزەدی چ شتێکە .. کەوابێ، ئەگەر ئەو نەبوایە، گەردوونیش و مرۆڤیش هیچ مانایەکیان نەدەبوو .. بەڵێ، حەزرەتی خۆشەویست (ﷺ) ئەو مرۆڤەیە کە واتای بۆ شتەکان گەڕاندەوە، ئەو لە نازدارترین خۆشەویست خۆشەویسترە لامان.

ئەگەر هێندەی کەسانی دی کە شتانی تر باس دەکەن، بمانتوانییایە پێغەمبەری نازدار ﷺ باس بکەین – کە بەداخەوە نەمانتوانیوە – بەو ئەندازەیەش کە کەسانی تر باس دەکرێن و برەویان پێ دەدرێت، زەمینە بسازایە بۆ ڕۆشنایی خستنە سەر لایەنەکانی کەسایەتیی ئەو، هونەر و گشت یەکە و دامەزراوەکانی ژیان بۆ ناساندنی ئەو سەفەربەر بکرانایە، ئەوا ئەو کاتە لە دەروونی نەوەکانی ئەمڕۆدا تەنها ئەو تەختی دادەنا و، دڵەکانیش تەنها بۆ ئەو لێیان دەدا ..

بۆیە داخۆ ئێمە وەك پێویست ئەو سوڵتانی دڵانەمان ناسیوە کە سوڵتانەکان فێری سوڵتانداریی دەکات؟ ئایا توانیومانە ئەو سەرووەرەی کە شاهی تەختی دڵانە، بە شێوەیەك شایانی قەدر و قیمەتی ئەو بێت، بە مرۆڤی ئەو سەردەمە بناسێنین و، بڵێسەی تاسە و شەیدایی لە ناخیاندا تاو بدەین؟

نەخێر! ئەگەر مرۆڤایەتی ئەوی بناسیایە، دەبووە مەجنونی و دەیدایە ئەو کەژ و هەردە، هەر کاتیش یادی شیرینی ئەو ڕۆحەکانی پێچابا، دڵی دەکەوتە جۆش و، چاوەکانی ئەسرینیان بۆ دەڕشت، ئیتر ئەو کات بۆ چوونە نێو جیهانی پاکی پێغەمبەرایەتییەکەیەوە، دەکەوتە پەرواز و لە پێناو گیان بەبەردا کردنەوەی خۆڵەمێشی دڵەی سووتاوی، کە لەتاو عەشقی ئەو گڕی سەندبوو، خۆی دەدایە بەر شنەی با تا بەرەو هەوارگەی ئەوینی ئەو ڕا پێچی بکا ...

# مەرجەکانی بڵاو بوونەوەی بابەت لەم گۆڤارە:

1- بابەتکە نوێ بێ و لە شوێنی دیکە بڵاونەبووبێتەوە.

2- بابەتەکان لە 2000 وشە تێنەپەڕن، گۆڤار بۆی هەیە بابەتی درێژ کورت بکاتەوە.

3- ئەو نووسەرەی کە یەکەم جارە بابەت دەنێرێ، باشترە چەند دێڕێک لە ژیاننامەی خۆی بنێرێ.

4- هەموو بابەتەکان دەکەونە بەر دیدی دەستەی نووسەران و ئەگەر لەگەڵ بنەما سەرەکییەکانی گۆڤار نەگونجان، بۆی هەیە رەتی بکاتەوە، یان داوا لە نووسەر بکا کە دەستکاری بکا.

5- گۆڤار ئەگەر بابەتێکی قەبووڵ کرد بۆ بڵاوکردنەوە، ئاگاداری نووسەرەکەی دەکاتەوە، بەڵام لەکاتێکدا بڵاونەبوویەوە، پەیوەست نین بە ئاشکرا کردنی هۆکاری بڵاونەبوونەوەی.

6- بابەتە بڵاوکراوەکان دەبنە موڵکی گۆڤار و هەر کاتێک بیەوێ بڵاوی دەکاتەوە، لە هەر توێژینەوە و پەرتووکێکیش پێی گونجاو بێ، بە زمانی خۆی یان وەرگێردراو بۆ هەر زمانێکی دیکە بڵاوی دەکاتەوە.

**تکایە بابەتەکان تەنها بۆ ئەم ئیمەیلەی خوارەوە بنێرن:**

Govari.raha@gmail.com



# پێرست




## ڕەهـــــا بـــۆچـــی ؟

لە سەروبەندی زیاد بوونی گروپە جیاوازەکان و سەر لێ شێوانی تاکی موسڵمان لە نێوانیاندا، پێمان باش بوو گۆڤارێکی ئەلکترۆنی دەربکەین تاوەکو تاکی مسوڵمان بە ئیسلامە ڕاستەقینەکەی شارەزا بکەین، پێناسەی ئیسلامە ڕەسەنەکەی بۆ بکەین، ئەو رووحیانەتەی کە لە باب وبا پیری دەیبینی و ئێستا لە کەسدا بەدی ناکات، ئێمە هەوڵ دەدەین ئیسلامی بەو جۆرە پێ بناسێنین

ڕەها بۆ ئەوەیە خەڵك بەرەو دیدێکی ناوەندگیر ببەین، وایان لێ بکەین گفت و گۆی بنیاتنەر بکەن و یەکتریان خۆش بوێ ئەگەر چی راشیان لە یەکتری جیاواز بێ

ڕەها بۆ ئەوەیە مرۆڤەکان بە فیترەتی خۆیان ئاشنا بکرێن، لەگەڵ ئاشنا کردنیشیان بە بابەتە سەردەمییەکان و دانەبڕان لێیان، لەگەڵ پڕکردنەوەی ئەو کەلێنانەی لە رۆشەنبیری تاکی خوێنەردا هەن و بۆ ئەوەی دونیا بینیان جوانتر بکەین

لەو پێناوەدا، رەها لەدایك بوو، سەرەتا بیرمان لە چاپکردنی گۆڤارەکە کردەوە، بەڵام دوای راوێژ لەگەڵ دەستەی نووسەران گەیشتینە ئەوەی کە باشترین و ئاسانترین رێگا بۆ بڵاوکردنەوە، رێگای ئەلکترۆنییە، لەهەرشوێنێکی ئەو دونیایە بێت خوێنەر بەدەستی دەگات

هیوا خوازین پەروەردگار لەم کارە سەرکەوتوومان بکا و ئەو بڵاوکراوەیە ئاما نجی خۆی بپێکێ

(بۆ هەر رەخنە و پێشنیارێك دەتوانن بەم ئیمەیلەی خوارەوە ئاگادارمان بکەنەوە)

Govari.raha@gmail.com